٤

زنجیرە وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## لجنة كتابة الدستور أرباب من دون الله

## لیژنەی نووسینەوەی دەستور كۆمەڵە پەرستراوێكن لەبری الله

وتاری شیخ

تقبله الله

أبو علي الأنباري

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری -تقبه اللە-

بەناونیشانی
لیژنەی نووسینەوەی دەستور – کۆمەڵە پەرستراوێکن لەبری اللە

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشیمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودبەخشمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار دەکەن بە زانستەکەیان، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە حوججە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە قسە و گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، خوایە داوای زانستێکی سوودبەخش و دڵێکی ترساو و جەستەیەکی ئارامگر لەسەر بەڵات لێ دەکەم، لە پاشاندا:

دوێنێ بە فەزڵ و منەتی الله تعالى قسەمان کرد دەربارەی ڕاستییێتی لیژنەی نووسینەوەی دەستور و وتمان ئەوان هاوبەشانێکن بۆ الله تعالى و ئەم وتەیەی الله تعالى ـمان بە بەڵگە هێنایەوە: ﴿...إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠﴾[1] ئەمڕۆش باسی هەندێك بابەتی تری پەیوەست بە لیژنەی نووسینەوەی دەستور دەکەین کە بریتییە لە ڕاستی دووەمی ئەم لیژنەیە ئەویش بریتییە لەوەی ئەوان کۆمەڵە خوا و پەرستراوێکن لەبری الله

**لیژنەی نووسینەوەی دەستور کۆمەڵە خوایەکن لەبری الله**

بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله تعالى هاتووە لەم وتەیەیدا -عز وجل- لە سوڕەتی (التوبة) : ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١﴾ واتە: حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە خوای خۆیان لە جیاتی اللە، هەروەها مەسیحی کوری مەریەمیش (بە کوڕی خوا دەزانن) لە کاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خوایەك، بێگومان جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە (ئەو نەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.

تەفسیری ئەم ئایەتە چییە ؟ وە چۆن ئەم ئایەتە دەکەیتە بەڵگە لەسەر ئەوەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور کۆمەڵە خوایەکن لەبری الله ؟ پشتبەستوو بە الله عز وجل دەڵێم:

[1] يوسف : ٤٠

لە سەرەتادا پێویستە زانیاری تەواومان هەبێ کە مەبەست کێیە لەم ئایەتەدا (ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ) مەبەست لەم ئایەتە: جوولەکە و نەساڕان و بەڵگەش لەسەر ئەمە -لەسەر ئەوەی کە ئایەتەکە مەبەستی لە جوولەکە و نەساڕایە- ئەو ئایەتەی پێش خۆیەتی، الله عز وجل دەفەرموێت﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ۝٣٠ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾[٢] کەوایە ئەو ئایەتەی لە پێش خۆی هاتووە ڕوونی دەکاتەوە کە مەبەست لە (ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ) بریتیین لە جوولەکە و نەساڕا، ئەمە بەڵگەی یەکەم و کە هەر ئەم بەڵگەیەشت بەسە، بەڵام لە پێناو سوودی زیاتر و چۆنیش ئایەتەکان بە بەڵگە دەهێنینەوە بۆیە بەڵگەیەکی تر دەهێنمەوە.

الأحبار: الله تعالى لەم ئایەتەدا دوو ناوی هێناوە فەرموویەتی (أحبار و رهبان)، الأحبار هەروەك لە (مختار الصحاح)دا هاتووە: "الحبر واحدُ واحدٌ وهم أحبار اليهود" واتە زانایانی جوولەکە، بە هەمان شێوە لە لای ئیمامی ئالوسی-رحمه الله- لە تەفسیرەکەی دەڵێت: "الأحبار: بریتیین لە زانایانی جوولەکە" وە ئیبن ئەبی حاتەم-رحمه الله- لە تەفسیرەکەیدا لە (الضحاك)ـەوە نەقڵی کردووە کە وتویەتی: "الأحبار: بریتیین لە زانایانی جوولەکە یان خوێنەرەکانیان" بەڵام ئالوسی -رحمه الله- لە تەفسیرەکەیدا باسی شتێکی تری کردووە دەڵێت: وشەی حبر کە بریتییە لە زانا، بەکاردەهێنرێت بۆ موسڵمان و بە هەمان شێوە بۆ زیممی [خاوەن پەیمان] بەکاردەهێنرێت چونکە ئیبن عەباس -رضي الله عنه- پێی دەوترێت حبری ئوممەت"، وە وشەی حبر دروستە بە فەتحە یاخود بە کەسرە بیڵێی-بۆ پیتی حاء- (حِبر یان حَبر) هەردووکیان یەك واتای هەیە بە ویستی الله تعالى، کەوابوو مەبەست لە (الأحبار) هەروەك ئالوسی و (الضحاك) -ڕەحمەتی الله تعالى ـیان لێ بێت- وتیان بریتیین لە زانایانی جوولەکە، سەبارەت بە (الرهبان) ئەوا زانایانی نەساڕان، کە ئالوسی -رحمه الله- دەقی لەسەر ئەمە هەیە، کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەبەستی ئایەتەکە لە جوولەکە و نەساڕایە، هۆکارێکی دڵنیاکەرەوەیە لەسەر ئەم ئایەتە بۆ بابەتێکی پەیوەندیدار بە بابەتەکە (دواتر شێخ باسی پەیوەندییەکە دەکات بە درێژی).

بەڵگەی تر لەسەر ئەوەی مەبەستی ئایەتەکە جوولەکە و نەساڕایە: ئەوەیە کە ئەم ئایەتە جێناوەکانی تیادایە و هەروەك دەزانن جێناویش لەبری ناوێکە بۆیە ئەگەر بمانەوێت جێناوەکان بگەڕێنینەوە بۆ ناوەکان، ئەوکاتە ئایەتەکە لە دەرەوەی قورئان بەم شێوەیەی لێ

[٢] التوبة:٣٠

دێت: اتخذ اليهود أحبار اليهود أربابا من دون الله ، اتخذ النصارى رهبان النصارى أربابا من دون الله، بۆیە ئەو بەڵگانە هەموویان دەیسەلمێنن کە ئایەتەکە مەبەستی لە جوولەکە و نەسارایە.

واتای أرباب: (ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا)، أرباب کۆی رب ـە کە بریتییە لە پەرستراوی گوێڕایەڵیکراو ئەگەر بە تاك باسکرا، وشەی الرب ئەگەر بە تاك هات بە واتای پەرستراو دێت و بە واتای گوێڕایەڵیکراویش دێت بەڵگەی ئەمەش لە سورەتی (مریم) الله تعالی دەفەرموێت: ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ٦٥﴾ ، واتە: ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوانی نێوانیانە، کەواتە، هەر ئەو بپەرستە و زۆر بەردەوام و خۆگربە لە پەرستنیدا، ئایا کەس شك دەبەیت هاوناوی ئەو و هاوتای ئەو بێت. فەرمووی: (رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ) پاشان فەرمووی (فَٱعۡبُدۡهُ)، هەروەها لە سورەتی (البقرة) الله تعالی دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١﴾ ، واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوە و پێشینانی ئێوەشی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی خواناسی و تەقوا و پارێزکاری بگرنە بەر. کەوایە (الرب) بریتییە لە پەرستراو و گوێڕایەڵیکراو، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئەوان نوێژیان بۆ بکەن و ڕۆژوویان بۆ بگرن، نەخێر بەڵکو گوێڕایەڵیەکەیان لە جۆرێکی ترە، کاتێك قسە دەکەین لە دەربارەی هەڵوێستمان بەرامبەر دەستور ئەوکاتە بە فراوانی و بەدرێژی دەچینە نێو بابەتەکەوە بە ئیزنی الله تعالی.

کەواتە ئێستا زانیت زانایانی جوولەکە و قەشەکانی نەسارا بوونەتە کۆمەڵە خوایەك، چۆن ئەوانە بوونە خوا و پەرستراو ؟ فەرموودەیەك کە ئیمامی موسلیم -رحمه الله- گێڕاویەتیەوە لە (البراء بن عازب)ـەوە، وە بەر لە باسکردنی فەرموودەکە ئاماژە دەکەم بۆ شتێك: زانایانی جوولەکە کە حاخامەکانن لە هەندێك حوکمەکانی شەریعەتی پێغەمبەر موسا یان گۆڕی بوو و شتی تریان هێنابووە جێگەی، وە زانایانی نەسارا دینی پێغەمبەر عیسا یان گۆڕی بوو جا کاتێك ئەم زانایانە هەندێك تەشریع یان تەواوی دینەکەیان گۆڕی بوو لە تەوحیدەوە بۆ بە سێ گرتن و جوولەکە و نەساراش گوێڕایەڵی زاناکانیان کرد لەم گۆڕانکارییەی هێنایان، لێرەوە الله عز وجل لە دەربارەیان فەرموویەتی کە ئەو زانایانە ئێستا بوونەتە پەرستراو لەبری الله، کەوایە هۆکارەکە ئەوەیە ئەوان گۆڕانکارییان کرد لە شەریعەتی پێغەمبەر موسا -زانایانی جوولەکە- وە قەشەکانی نەسارا گۆڕانکارییان کرد لە شەریعەتی پێغەمبەری عیسا درود و سەلامی الله تعالی لەسەر پێغەمبەری ئێمە و ئەوانیش بێت، بەڵگە چییە لەسەر گۆڕانکاری و دەستکاری جوولەکە و بەڵگەش لەسەر گۆڕانکاری و دەستکاری زانایانی نەسارا لە

دینەکانیان ؟ سەبارەت بە زانایانی جوولەکە -حاخامەکان- فەرموودەیەك کە ئیمامی موسلیم -رحمه الله- گێڕاویەتیەوە لە (البراء بن عازب ـەوە -رضي الله عنه-) دەڵێت: جوولەکەیەکی داخ کراوی جەڵدە لێدراو بەلای پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی - پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە بوو- جوولەکە بەلایدا تێپەڕین کە یەکێکیان پیاوێکی داخ کراوي جەڵدە لێدراو بوو، وە واتای "مەحموم": واتە خەڵوز لەسەر سەری دانرابوو کە بریتیە لە پاشماوەکانی ئاگر لەگەڵ خۆڵەمێش لەگەڵ ئاو، وە "مەجلود" بریتی بوو لەوەی سواریان دەکرد لەسەر ئاژەڵ بە هەڵگەڕاوەیی (واتە پشتی لە لای سەری ئاژەڵەکە دەبوو، وە ڕوخساریشی لە لای پشتەوەی ئاژەڵەکە) - جا پێغەمبەرﷺ بەم جوولەکانەی فەرموو: ئایا حەددی زیناکەر بەم شێوەیەیە لە پەڕتووکەکەتان ؟ وتیان: بەڵێ، پاشان بانگی پیاوێکی ئەوانی کرد و فەرمووی: سوێندت دەدەم بەو الله ـیەی تەوراتی دابەزاندووە بۆ سەر موسا ئایا حەددی زیناکەر بەم شێوەیەیە لە پەڕتوکەکەتان ؟ -جوولەکەکەش وتی- : ئەگەر سوێندت نەدابومایە پێم نەدەوتی، بەڕاستی حەددەکە ڕەجم کردنە -پاشان وتی- : بەڵام زیناکردن زۆربوو لەنێو خانەدانەکانمان بۆیە ئەگەر خانەدانێك زینای بکردایە وازمان لێی دەهێنا، وە ئەوەی ژێردەستە و ئاسایی بوو ئەگەر زینای بکردایە ئەوا حەددەکەمان لەسەری جێبەجێ دەکرد، بۆیە وتمان وەرن با کۆببینەوە لەسەر حوکمێکی ئاسان لەسەر خانەدان و لەسەر کەسی ئاسایی جا کردمان بە داخ کردن (التحميم) و جەڵدە لێدان لە جیاتی ڕەجم کردن.ئەم جوولەکەیە هەواڵی بە پێغەمبەر دا ﷺ بەوەی ئەوان زاناکانیان کۆببونەوە لەسەر گۆڕینی حەددی زیناکەر لە ڕەجم کردنەوە بۆ جەڵدە لێدان و داخ کردن، وە جوولەکە گوێڕایەڵیان کردن لەم تەشریعەی هێنایان، لێرەوە الله عز وجل ناوی نان بە -کە ئەم حاخامانە بوونە- خوا و پەرستراو لەبری الله، ئەمە سەبارەت بە زانایانی جوولەکە بوو.

بەڵام سەبارەت بە زانایانی نەساڕا: هەروەك دەزانن کە ئەم دینە دینی تەوحید و یەکخواپەرستی بوو بەڵام ئێستا دەبینین بووە بە دینی بە سێ گرتن (التثليث)، وە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەم دینەی دەیبینین دیار و بڵاو بوو لەو کات بە بەڵگەی ئەوەی الله عز وجل ئەم فەرموودەیەی خۆی دابەزاند﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ﴾ [٣]، واتە: بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا یەکێکە لە سێ دانە خوا.

کەوابوو ئەم دینە گۆڕدرابوو لە تەوحیدەوە بۆ بە سێ گرتن، چۆن گۆڕدرا ؟ مێژوونوسان باسی پوختەیەکیان کردووە لە دەربارەی ئەم بابەتە، ئەویش ئەوەیە دوای ئەوەی الله عز وجل عیسای بە پێغەمبەر نارد بە پەیامەکەی بۆ نەوەی ئیسرائیل و خەڵکیش دەستیان کرد بە چوونە

[٣] المائدة : ٧٣

نێو ئەم دینە نوێیە و وازیان دەهێنا لە دینی پێغەمبەر موسا، جوولەکەش ڕازی نەبوون بۆ هیچ کەسێك وازبێنێت لە دینی پێغەمبەر موسا و بچێتە نێو ئەو دینەی پێغەمبەر عیسا هێنابووی بۆیە زاناکانیان دەستیان کرد بە فەتوا دان بۆ کوشتنی ئەوانەی دەچنە نێو دینی نەسڕانیەت، وە کوشتن لەناویاندا زۆر و بڵاو بووەوە و توندتریان لەسەر نەساڕا پیاوێکی جوولەکە بوو بەناوی "شائۆل"، چەندین گوندی بەتەواوی ئیبادە کرد بەڵام بینیان ئەم ڕێگەیە بۆ قەدەغەکردنی خەڵکی لەوەی بچنە نێو دینی نەسڕانیەت هیچ سوودێکی نەبوو، وە لەسەر ڕێچکەکەیان لە پیسی و چەپەڵی لە بیرکردنەوەدا، شائۆل هاتە لای هاوەڵە دڵسۆزەکانی [حەوارییەکان] پێغەمبەر عیسا و وتی: من بە بیاباندا دەڕۆیشتم و گوێم لە بانگدەرێك بوو بانگی دەکرد پێی وتم: ئەی شائۆل بەسە کوشتنی هاوەڵانم ئیتر ببە بە یەکێك لە شوێنکەوتووانم، وە من دەمەوێت بێمە نێو دینی نەسڕانیەت، حاخامەکان لەو کاتەدا دژی ئەوە وەستانەوە کە ئەو پیاوە شائۆل بووەتە نەسڕانی بەهۆی توندوتیژ بوونی لەسەر نەساڕا لە کوشتندا، بەڵام لەناویاندا پیاوێك هەبوو بەناوی بەرنابا -کە ئەم ناوە هەیە هەروەك دەزانن ئینجیلێکی هەیە و دانپێدانراویش نیە- هەروەك بڵێی دڵی باشە جا ڕووی لێکرد بۆ ئەوەی باوەش بەم پیاوە دا بکات کە بووەتە نەسڕانی، ئینجا دەستی کرد بە تێکدانی ئەم دینە لەناوەوەی جا دەستی کرد بە فڕێدانی گومان و شوبهە، یەکەم گومان کە خستیە ڕوو وتی: ئایا دەکرێت منداڵێك لە دایك ببێت بەبێ ئەوەی باوکی یان دایکی هەبێت ؟ وتیان: نەخێر ناکرێت، سوننەتی اللە ـیە -عز وجل- کە منداڵ لە باوك و دایکێکە، پرسیاری کرد: کەواتە کێ باوکی عیسایە ؟ وتیان: باوکی نیە. کەوایە سەرپێچی ئەو پێشەکیەتان کرد کە لەسەری ڕێککەوتبووین -کاتێك هیچ وەڵامێکیان دەست نەکەوت بۆ ئەم پرسیارە- وتی: مادام هیچ باوکێکی مرۆیی نیە کەواتە باوکی اللە یە! وە تەسلیمی ئەو گومانە بوون پەنا بە اللە.

دوای ئەوەی دڵەکانیان زۆری خواردەوە لەم شوبهەیە ئینجا شوبهەی دووەمی هێنا و وتی: مادام ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی باوکی عیسا -پاکی و بێگەردی بۆ اللە تعالی- اللە باوکیەتی، ئێمە دەزانین کە ئەم منداڵە نابێت تەنها بە بەشێك لە باوك و بەشێك لە دایك نەبێت، کەوایە عیسا شتێکی لە مەریەم تیادایە و بە هەمان شێوە شتێکی لە اللە تیادایە -بەرزی و بڵندی و پاکی بۆ اللە لەوەی ستەمکاران دەیڵێن، ئەو زاتە زۆر بەرز و بڵندترە- دوای ئەوەی خۆیان بەدەستەوە دابوو بۆ شوبهەی یەکەم ئیتر پێویستە خۆیان بەدەستەوە بدەن بۆ شوبهەی دووەم، وتیان ڕاستە، کەوایە ئەو شتێکی تیادایە لە اللە و شتێکیشی تیادایە لە مەریەم، وە عەقیدەی نەساڕا تاوەکو ئەمڕۆمان دامەزراوە لەسەر ئەم بناغەیە، دەڵێن عیسا بەشی لاهوتی و بەشی ناسوتی تیادایە، مەبەستیان لە بەشی لاهوتی ئەوەیە واتە عیسا اللە باوکیەتی، وە بەشێك لە اللە

لە عیسا دایە، وە ناسوتی: بەشێکە لە مەریەم کە لە عیسا دا هەیە، خۆیان دا بەدەستەوە بۆ ئەم شوبهەیە پاشان دوای ئەوە دوایین شوبهەی هێنا کە وتی: مادام ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر عیسا شتێکی لە اللە عز وجل تیادایە، کەواتە شایستەی ئەوەیە بپەرسترێت، ئەو بەشە خواییەی لە عیسا هەیە دەپەرستین، وە بەهۆی ئەمەوە ئەم دینەی گۆڕی لە دینی تەوحیدەوە بۆ دینی بە سێ گرتن و ئینجا وتی: اللە ، کوڕ ، ڕوحی پیرۆز، جا بەمەش بوونە سێ خوایەکە، وە نەسارا گوێڕایەڵیان کرد و شوێنی کەوتن -شائۆل- ئەوەی کە هێنابووی لە شوبهەکان و زانایانی نەساڕاش تا ئێستا بانگەشە بۆ ئەم شوبهەیە دەکەن و نەسڕانیەکانیش گوێڕایەڵییان دەکەن، ئەمەش لە بیر نەکەین کە شائۆل دوای ئەوەی هاتە نێو دینی نەسڕانیەت ناوی لەخۆی نا "قولوس الرسول" و هەندێك پەیامی هەیە لە ئینجیل، چەند نامە و پەیامێك بۆ ڕۆما چەند پەیامێك بۆ فلان و فلان، کەوایە ئەو پیاوێکی لەپێشە لەناویاندا بەڵام ئەو پیاوە بوو ئەم دینەی گۆڕی لە دینی تەوحیدەوە بۆ دینی بە سێ گرتن و نەسارا گوێڕایەڵییان کرد و تا ئێستاش هەر گوێڕایەڵی دەکەن، بۆیە زاناکان بەم گۆڕانکاری و دەستکاریە لەم دینەدا و نەساڕاش گوێڕایەڵییان دەکەن، بەمەش ئەو زانایانە بوونەتە کۆمەڵە خوا و پەرستراوێك لەبری **اللە.**

سەرنجێکی گرنگ هەیە ئاماژەی پێدەدەم لە چوارچێوەی ئەم بابەتەدا: ئەوەی ناوی نا لە زاناکانی دەستکاریکەری شەریعەتی پێغەمبەر موسا و شەریعەتی پێغەمبەر عیسا: رب ، اللە تعالی بوو لە ڕێگەی وەحی لە قورئان، واتە حوکمەکە لە اللە ـیە -عز وجل- نەك لە ئینسانەوە، بۆیە زانایان ئەگەر شەریعەتی پێغەمبەرێکیان گۆڕی و دەستکاری کرد و خەڵکیش گوێڕایەڵییان کردن لەم گۆڕانکاریەدا، ئەوا ئەم زانایە بە پەرستراو (رب) لە قەڵەم دەدرێت بۆ ئەوانە.

باشە، ئێستا دێینە سەر ئەمە: **پەیوەندی لیژنەی نووسینەوەی دەستور چییە بەوەی وتمان ؟**

لیژنەی نووسینەوەی دەستور باسنەکراون لەم ئایەتەدا، بەڵکو ئەوەی باسکراون بریتیین لە حاخامەکانی جوولەکە و قەشەکانی نەساڕا، بەڵام لیژنەی نووسینەوەی دەستور ئەوانە باسنەکراون لەم ئایەتەدا جا ئایا دەچنە نێو حوکمی ئەم ئایەتە یان نا ؟ دەچنە نێویەوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە:

**یەکەم:** فەرموودەیەك کە ئەبو سەعیدی خودری -رضي اللە عنە- گێڕاویەتیەوە دەڵێت: (قال رسول اللە ﷺ: لتتبعن سنن من قبلكم شبرا بشبر، وذراعا بذراع، حتى لو سلكوا جحر ضب لسلكتموه، قالوا : يا رسول اللە اليهود والنصارى ؟ قال : فمن)[٤] ، واتە: پێغەمبەر ﷺ

٤ الحديث رواه البخاري ومسلم واللفظ للبخاري -رحمه اللە-

فەرمووی: شوێنی ڕێباز و ڕێچکەکانی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون بست بە بست، و باڵ بە باڵ، تەنانەت ئەگەر ئەوان بچنە کونی بزنمژەوە ئەوا بەدوایاندا دەچن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت جوولەکە و نەساڕایە؟ فەرمووی: ئەی کێ.

کەوایە هەرچی ئەوەی ڕوودەدات لە لای جوولەکە و لەلای نەساڕا ئەوا لە ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوودەدات، ئەوانەی کاری ئەوانە دەکەن، ئەوەی زاناکان لە دینی پێغەمبەر موسا و لە دینی پێغەمبەر عیسا کردیان و دینەکەیان گۆڕی و دەستکاری کرد، دەبینین کە لیژنەی نووسینەوەی دەستور شەریعەتی پێغەمبەری خوایان ﷺ گۆڕیوە، ئەوەیان کردووە بە دینەکەمان کە حاخام و قەشەکان کردیان بە دینی پێغەمبەر موسا و دینی پێغەمبەر عیسا (لتتبعن سنن من قبلكم شبرا بشبر، وذراعا بذراع، حتى لو سلكوا جحر ضب لسلكتموه، قالوا : يا رسول الله اليهود والنصارى ؟ قال : فمن)، کەوابوو ئەوەی زانایانی جوولەکە و نەساڕا کردیان، ئەوا لەم ئوممەتەدا بە هەمان شێوە زانایانێك ئەمە دەکەن لە شەریعەتی پێغەمبەرمان محمد ﷺ کە ئەوەی ئەوان کردیان بە شەریعەتی پێغەمبەرەکانیان، ئەمە بەڵگەی یەکەم.

**بەڵگەی دووەم:** قاعیدەیەك هەیە لە شەرعی پاك و پیرۆزمان دەڵێت: حوکمە ئیسلامییەکان لەگەڵ هۆکار و عیللەتەکانی دەچێت بەڕێوە، لە کوێ هۆکارەکە هەبوو ئەوا حوکمەکەش دەبێت،

هۆکاری ناونانی اللە عز وجل لە زانایانی جوولەکە و نەساڕا بە خوا و پەرستراو، هۆکار و عیللەتەکە لە کوێدایە ؟

هۆکارەکەیە ئەوەیە ئەوان شەریعەتی پێغەمبەر موسایان گۆڕی و جوولەکەش گوێڕایەڵییان کردن، وە شەریعەتی پێغەمبەر عیسایان گۆڕی و نەساڕاش گوێڕایەڵییان کردن، کەواتە عیللەتەکە لە گۆڕانکاریەکەیە لەگەڵ گوێڕایەڵی کردنەکە، ئەوان گۆڕییان و خەڵکانێکیش گوێڕایەڵییان کردن لەم گۆڕانکاریەدا، ئەم عیللەتە هاتووەتەدی لە لیژنەی نووسینەوەی دەستور، کە بەڕاستی شەریعەتی پێغەمبەریان ﷺ گۆڕیوە و جێگۆڕینیان پێکردووە و جێگرەوەیان هێناوە، وە هەروەك دەزانن چەند لە خەڵکی ئێستا گوێڕایەڵییان دەکەن لەسەر ئەو جێگرەوەی کە هێناویانە، کەوایە ئەوەی ڕوویداوە لە زانایانی جوولەکە و زانایانی نەساڕا ئەوا لەوانەش ڕوویداوە بە هەمان شێوە، ئەگەر هۆکار و عیللەتی ناونانی زانایانی جوولەکە و نەساڕا بە پەرستراو: گۆڕین و دەستکاری کردن بێت، ئەوا ئەم هۆکارە هاتووەتەدی لە لیژنەی نووسینەوەی دەستور، چونکە شەریعەتی پێغەمبەری خوا یان ﷺ گۆڕیوە، وەك ئاشکرایە اللە عز وجل هیچ مافێکی نەداوە بە کەس کە شتێك بگۆڕێت لەم شەریعەتەی باسکرا، ئەمە

بەڵگەی دووەم لەسەر ئەوەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور دەچنە نێو حوکمی ئەم ئایەتە.

**بەڵگەی سێیەم:** پێی دەوترێت قیاسی لەپێشتر (قیاس الأولى) وە پێناسەی (قیاس الأولى) -بە واتا و مانا باسی دەکەم-: بریتییە لەوەی حوکمێك بێت لە دەقدا - لە دەقێك لە دەقەکان حوکمێك بێت- پاشان بێ دەنگ بێت لە حوکمێك کە لەپێشترە بۆ باسکردن لە باسکراوەکە. واتە حوکمێك هەبێت لە دەقێکدا، وە دەقەکەش بێ دەنگ بێت لە حوکمێکی تر جا ئەوەی بێ دەنگ بووە لێی لەپێشترە بۆ باسکردن لەوەی کە باسکراوە، ئەمە زانایانی ئوسوڵ پێی دەڵێن: قیاس الأولى، نموونەی ئەمە: وتەی الله تعالى ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ۝٢٣﴾ [٥]، واتە: (تەنانەت) ئۆفیان لە دەست مەکە و پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسە و گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت. الله عز وجل دەفەرموێت: (فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ)، ئەگەر پیاوێك بێت و بڵێت: ئەی شێخ ئایا دەکرێت کەسێك لە باوکی یان دایکی بدات ؟ دەڵێی: نەخێر، لە پێشترە کە ناکرێت و نابێت، چونکە الله عز وجل ڕازی نابێت بەوەی بڵێیت ئۆف، ئیتر چۆن بە لێدانیان ڕازی دەبێت! کەوایە بەڵگەکە باسی ئۆفی کردووە و باسی لێدانی نەکردووە هەرچەندە لێدان لەپێشترە بۆ ڕێگری لێکردن لە ئۆف، بۆیە ئەگەر ئۆف قبوڵ نەکرێت کەواتە لەپێشترە کە لێدان قبوڵ نەکرێت.

بە هەمان شێوە وتەی الله تعالى ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَـٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ ۝٣١﴾ [٦] واتە منداڵەکانتان مەکوژن بەهۆی ترسان لە هەژاری، کەوایە دەوڵەمەند لەپێشترە بەوەی منداڵەکانی نەکوژێت چونکە لێرەدا عیللەتەکە لەودا نیە، ئەمەش پێی دەوترێت قیاسی لەپێشتر.

بەڵگەی سێیەم وتمان قیاسی لەپێشتر، بە قیاسی لەپێشتر: لیژنەی نووسینەوەی دەستور لەپێشترە حوکمی ئەم ئایەتە بیگرێتەوە لە زانایانی جوولەکە و لەپێشترە لە زانایانی نەساڕا، ئەوەی کە بوترێت لە دەربارەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور خوا و پەرستراو لەپێشترە وەك لەوەی بڵێین لە دەربارەی زانایانی جوولەکە و زانایانی نەساڕا کە ئەوان خوا و پەرستراون، ئەمەش لە سێ ڕووەوە -ئەوانە لەپێشترن پێیان بوترێت پەرستراو لە سێ ڕووەوە-

**ڕووی یەکەم:** شەریعەتی پێغەمبەر موسا و شەریعەتی پێغەمبەر عیسا -درود و سەلامی الله لەسەر پێغەمبەرمان و ئەوانیش بێت- بۆ هەندێك گەلی تایبەت بوو، بۆ نەوەی ئیسرائیل ئەو شەریعەتانەی کە زانایان دەستێوەردان و یاریان پێدەکرد و الله عز وجل ـیش ئەو یاریپێکەرانەی ناونا بە پەرستراو، ئەم شەریعەتانە و ئەم دینە بۆ گەلێکی تایبەت بوو کە

[٥] الإسراء: ٢٣

[٦] الإسراء: ٣١

ئەوانیش نەوەی ئیسرائیل بوون هەروەك لەم ئایەتانەی سورەتی (الصف) هاتووە، الله تعالى دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝٦﴾ ، واتە: بیریان بخەرەوە، کاتێك موسا بە قەومەکەی وت: ئەی قەومەکەم ئێوە بۆچی ئازاری ڕۆح و دڵم دەدەن، لە کاتێکدا بێگومان دەزانن کە من پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوام بۆتان، جا کاتێك ئەوان گوێیان بۆ ڕاستی نەگرت و لە حەق لایاندا، خوایش دڵەکانیانی لە خشتە برد و مۆری پێدا نا، چونکە خوا ڕێنموویی قەوم و هۆزی تاوانکار و لە سنوور دەرچوو ناکات * وە بیریان بخەرەوە، کاتێك عیسای کوڕی مەریەم بە نەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم کە لە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی -ئەحمەد-ـە، کەچی کاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواو و موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

کەوایە ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر موسا نێردرابوو بۆ نەوەی ئیسرائیل و ئایەتەکەی تریش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر عیسا بە هەمان شێوە نێردرابوو بۆ نەوەی ئیسرائیل کە ئەوانیش قەومێکی تایبەت و دیاریکراون، لە کاتێکدا شەریعەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو خەڵکیە نەك بۆ گەلێکی دیاریکراو هەروەك لەم ئایەتەی سورەتی (الأعراف) هاتووە ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ۝١٥٨﴾ ، بۆ لای دەستەیەك یان کۆمەڵێك یان گەلێك نیە، بەڵکو بۆ تەواوی خەڵکیە، وە لە ئایەتێکی تردا ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۝٢٨﴾[٧] وە لە ئایەتێکی تردا﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ۝١٠٧﴾[٨]، کەوابوو ئەو دینانەی زاناکان یاریان پێدەکرد و دەیانگۆڕی ئەوا بۆ چەند گەلێکی تایبەت بوو، بەڵام ئەمەیان بۆ هەموو ئینسانیەتە بۆیە ئەوەی دەستێوەردان و یاری بکات بە دینێك کە بۆ هەموو ئینسانەکانە ئەوا حاڵی زۆر خراپترە لەو کەسەی یاری دەکات بە دینێك کە تایبەتە بۆ گەلێکی دیاریکراو، ئەمە ڕووی یەکەم.

**ڕووی دووەم:** ئەو شەریعەتانە نەسخ بوونەوە بە ناردنی پێغەمبەر ﷺ ، کەوایە مەودایەکیان هەیە لە ڕووی کاتەوە، بە ناردنی پێغەمبەر ﷺ کارکردن بە تەورات کۆتایی هات و هەروەها

[٧] سبأ: ٢٨

[٨] الأنبياء: ١٠٧

کارکردن بە ئینجیل کۆتایی هات بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەم فەرموودەیەی اللە تعالی ـیە ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ۝٨٥﴾ [٩] واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانە.

ئەو شەریعەتانەی زانایانی جوولەکە و نەسارا گۆڕانکاریان تیادا کرد بۆ کاتێکی دیاریکراو بوون بەگوێرەی ویستی اللە عز وجل بەڵام ئەم دینە لەو کاتەوەی پێغەمبەر ﷺ نێردراوە دەمێنێت تاوەکو هەڵسانی قیامەت، چونکە هیچ پێغەمبەرێك نایەت دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵگەش هەروەك لە سورەتی (الأحزاب) هاتووە ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّۦنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ۝٤٠﴾، واتە: محمد (ﷺ) وەنەبی باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان بێت بەڵکو پێغەمبەری خوایە و دواهەمینی پێغەمبەرانە.

بۆیە هیچ پێغەمبەرێك نایەت دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە ئەم شەریعەتە لەو کاتەوەی پێغەمبەر ﷺ نێردراوە و بووە بە پێغەمبەر تاوەکو هەڵسانی قیامەت دەمێنێت، جا ئەوەی یاری بکات بە شەریعەتێك کە اللە عز وجل دایناوە بۆ هەموو خەڵك تاوەکو هەڵسانی قیامەت زۆر خراپترە لە حاڵی زانایەك کە دەستکاری و یاری کردووە بە شەریعەتێك اللە عز وجل ویستی لێ بووە ماوەیەکی دیاریکراوی هەبێت، ئەمە ڕووی دووەم لەوەی حوکمی ئەم ئایەتە ئەوانە -لیژنەی نووسینەوەی دەستور -دەگرێتەوە.

**سەبارەت بە ڕووی سێیەمیش:** ئەم شەریعەتە خواییە اللە عز وجل تەواو و کاملی کردووە و پێی ڕازی بووە بۆمان ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۝٣﴾ [١٠] ، جا کاتێك لیژنەی نووسینەوەی دەستور دەستکاری دینێك دەکەن کە اللە تعالی تەواوی کردووە و دەستکاری دینێك دەکەن کە اللە تعالی پێی ڕازی بووە بۆ هەموو ئینسانەکان تاوەکو هەڵسانی قیامەت، لە کاتێکدا ئەم وەسفانە نەوتراوە نە دەربارەی تەوڕات و نە دەربارەی ئینجیل، کەواتە ئەوانە -لیژنەی نووسینەوەی دەستور- حاڵیان خراپترە لە حاخامەکانی جوولەکە و حاڵیان خراپترە لە قەشەکانی نەسارا، وە ئەوان لەپێشترن لەوەی حوکمی ئەم ئایەتە بیانگرێتەوە، کەوابوو پوختەی ئەوەی دەستمان دەکەوێت ئەوەیە کە لیژنەی نووسینەوەی دەستور کۆمەڵە خوا و پەرستراوێکن لەبری اللە عز وجل، ئاشکرایە بە ویستی اللە ئەم بابەتە ؟ الحمد للە.

[٩] آل عمران: ٨٥
[١٠] المائدة: ٣

ڕاستییێكی تر لە دەربارەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور: ئەوەیە كە ئەوانە ڕەتكەرەوە و پەكخەری حوكمەكانی الله ـن -عز وجل-، وەك جەختكردنەوەیەك لەسەر بابەتی دووەم كە باسمان كرد ئەوان گۆڕیویانە و دەستكاریان كردووە، ئێستاش دەڵێین لیژنەی نووسینەوەی دەستور حوكمەكانی الله تعالی ـیان ڕەتكردووەتەوە و پەكخستووە، وە الله تعالی مافی بە هیچ كەسێك نەداوە ڕەتكردنەوە و هەڵوەشاندنەوە بكات لەسەر شتێك لە حوكمەكانی، بەڵگەش لەسەر ئەمە لە سوڕەتی (الرعد) الله تعالی دەفەرموێت ﴿وَٱللَّهُ يَحۡكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكۡمِهِۦۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ۝٤١﴾ واتای (التعقيب) : ئیمامی بەغەوی -رحمه الله- لە تەفسیرەكەیدا دەڵێت: واتە هیچ ڕەتكەرەوەیەك نیە بۆ بڕیارەكانی و هیچ هەڵوەشێنەرێك نیە بۆ حوكمی ئەو، وە هەروەها لە لای ئیمامی ئالوسی وتەیەكی هاوشێوەی ئەمە هەیە، كەواتە واتای (التعقيب) بریتییە لە ڕەتكردنەوە و هەڵوەشاندنەوە و بەتاڵكردنەوە و پەكخستن، ئەم مافەش الله عز وجل بە هیچ كەسێكی نەداوە دوای ئەوەی ئەم دینەی بۆ تەواو كردووین و ڕازی بووە پێی بۆمان، وە لیژنەی نووسینەوەی دەستور -هەروەك دەزانن- هیچ شتێكیان واز لێ نەهێناوە لەدینی الله عز وجل ئیللا ڕەتیان كردووەتەوە و پەكیان خستوە، (والله سريع الحساب) جا داواكارین لە الله بە زوویی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بكات لە دونیا پێش قیامەت.

[یەكێك لە قوتابیەكانی شێخ پرسیار دەكات لەبارەی مانای -التعقيب- جا شێخیش وەڵامی دەداتەوە بە وتەكەی بەغەوی هەروەك باسكرا]
هەڵوەشاندنەوە و ڕەتكردنەوە و پەكخستن و تەبدیل كردن، هەموو ئەمانە دەچنە نێو واتای (التعقيب) كە بریتییە لەوەی الله عز وجل حوكمێك بدات پاشان كەسانێك حوكمێك بێنن جیا لەو حوكمەی ئەو داویەتی، یان بە زیادكردن یان بە كەمكردن و نوقسان یان بە تەبدیل كردن یان بە هەڵوەشاندنەوە، ئەمە هەمووی پێی دەوترێت (تعقيب)، كەوایە لیژنەی نووسینەوەی دەستور هەر هەموو حوكمەكانی الله عز وجل ـیان ڕەتكردووەتەوە و پەكخستووە، بەڵكو هەموو شتێكی تریان هێناوە، وە ئەم قسەیەیان هەڵتنەخەڵەتێنێت كە دەڵێن شەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەیەكە لە سەرچاوەكانی تەشریع، وە هاوسەرگیری لە شەریعەتە و تەڵاق لە شەریعەتە، نەخێر، ئەم قسەیە هەڵتنەخەڵەتێنێ چونكە ئەوان لەبەر هیچ دەستیان بەمە نەگرتووە تەنها بەپێی هەوا وئارەزووی خۆیان نەبێت، ئەگەر باشتریان دەست بكەوێت لەوەی دەستیان كەوتووە لە دینەكەمان ئەوا دەستی پێوەدەگرن.

**دێینە سەر باسی ڕاستی چوارەم لە ڕاستییەكان لەسەر لیژنەی نووسینەوەی دەستور:** ئەوان بوونەتە شەریك و هاوەڵ بۆ الله عز وجل، وتمان هاوبەشن وتمان پەرستراون وتمان ڕەتكەرەوە

و پەکخەرن، ئێستاش دەڵێین کۆمەڵە هاوەڵ و شەریکێکن بۆ الله عز وجل، بەڵگەش لەسەر ئەمە هەروەك لە ئایەتی سورەتی (الشوری) هاتووە، الله تعالی دەفەرموێت﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ﴿٢١﴾﴾، ئەمەی کە لیژنەی نووسینەوەی دەستور دایناوە برایان ئەمە دینە، چونکە وشەی دین هەروەك دەزانن بەکاردێت بۆ دینی حەق و بۆ دینی باتڵ، جا باتڵ پێی دەوترێت دین و حەقیش بە هەمان شێوە پێی دەوترێت دین، بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله عز وجل ئەم فەرموودەیەیەتی﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا ﴿٨٥﴾﴾[11] ،کەواتە ئیسلام دینە و جگە لە ئیسلامیش دینە باتڵەکان بە هەمان شێوە الله عز وجل ناوی ناون بە دین، بەڵگەی تر لە سورەتی (الکافرون) الله تعالی دەفەرموێت بۆ موشریکەکانی مەککە ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾﴾ ، کەوایە ئەوەی موشریکەکان لەسەری بوون الله ناوی هێنا بە دین، وە هەروەها فیرعەون وتی ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ۖ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ ﴿٢٦﴾﴾[12]، واتە: وازم لێ بهێنن با موسا بکوژم، با هەر هاوار لە پەروەردگاری بکات، چونکە بەڕاستی من دەترسم کە دینتان بگۆڕێت، یاخود دووبەرەکی و خراپەکاری لە وڵات و سەر زەویدا بەرپا بکات.

جا ئەوەی لەسەری بوو ناوی نا دین، وە الله عز وجل ئەمەی پێمان ڕاگەیاندووە لە ڕێگەی وەحی لە قورئانی پیرۆز، کەوابوو دینی حەق پێی دەوترێت دین -ئیسلام دینە- وە جگە لە ئیسلامیش هەموو تەشریعەکان جا ئەگەر ئاسمانی بێت یان دەستکرد بێت هەموویان پێیان دەوترێت دین، مادام ئەوەی کە دایانناوە دەستکاری ژیانی ئینسان دەکات بۆیان دادەڕێژرێت و بەشداری دەکات لە ڕێکخستنی ژیانیان بۆیە پێی دەوترێت دین بەڵام دینێکی باتڵە کە الله عز وجل مۆڵەت و ڕێگەی پێنەداوە، جا هەر کەسێك دینێك دابنێت جیا لە دینی الله عز وجل دینێکی باتڵ جیا لە دینی الله عز وجل، و الله تعالی مۆڵەتی نەداوە پێی بە دانانی ئەم دینە، ئەوا دانەری دینەکە خۆی کردووەتە هاوەڵ و شەریکی الله عز وجل، وە هەر ئەمەش بوو وتمان لە وانەی یەکەم واتای (النّد) کەواتە ئەوان کۆمەڵە هاوەڵ و شەریکێکن بۆ الله عز وجل چونکە دینێکیان داناوە الله عز وجل مۆڵەت و ڕێگەی پێنەداوە کە دینێکی باتڵیشە.

**ڕاستی کۆتایی سەبارەت بە لیژنەی نووسینەوەی دەستور کە ڕاستی پێنجەمە:** ئەوان دۆستانی شەیتانن، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەی باسمان کرد لە پێشدا لە سورەتی (الأنعام) ﴿وَإِنَّ

[11] آل عمران: ٨٥

[12] غافر: ٢٦

ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ ﴿١٢١﴾ ، الله تعالى ناوی نا لەم بەشە: وەحییێك لە شەیتانەوە، کاتێك وتیان: بۆچی مەڕێك دەخۆن کە خۆتان سەری دەبڕن و مەڕێکیش کە الله عز وجل کوشتویەتی نایخۆن ؟ ، بۆیە خواردنی مردارەوە بوو تەشریعە، ئەم تەشریعە الله عز وجل لە دەربارەی دا فەرمووی ئەمە وەحییە لە شەیتانەوە بۆ دۆستەکانیان، باشە، لیژنەی نووسینەوەی دەستور کاتێك بە تەنیا دەچنە ژوورەکە و دەست دەکەن بە نووسینی ئەم قانونانە و ئەم دەستورانە، کە هەڵوەشێنەرەوەیە و ڕەتکەرەوە و پەکخەرە بۆ حوکمەکانی الله عز وجل و جێگرەوە و گۆڕدراوە، ئەو ماددانەی دەینوسنەوە من دڵنیام کە شەیتان لەگەڵیانە لە ژوورەکەدا هەرچەندە نابینرێت، وە وەحییان بۆ دەکات و ڕێخۆشکردنیان بۆ دەکات لەو کاتەی ئەم ماددانە و ئەم دەستورانە دەنوسنەوە، چۆن دڵنیابووم لە بوونی شەیتان لەو ژوورەدا لەگەڵیان ؟ چونکە ئەو زاتەی هیچ شتێکی لێ شاراوە و ون نابێت لە زەوی و ئاسمان فەرموویەتی ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ ﴿١٢١﴾﴾ وە لە توندترینی خەڵکی لە پشتیوانی و دۆستایەتی کردنی شەیتان، لیژنەی نووسینەوەی دەستورن، کەسەکە حوکمێك دەهێنێت، ئەمە ناکاتە هیچ لای شەیتان، دەکرێت وەحی بۆ بکات بە بابەتێکی بچووك وەك خواردنی مردارەوە بوو و ئەو جۆرە شتانە، بەڵام ئەوانە قانون دادەڕێژن، دەستکاری دینێکی تەواوکراو دەکەن کە لە هەموو وردەکاریەکانی ژیان دەدوێت، بۆیە ئەوانە -لیژنەی نووسینەوەی دەستور- بە دۆستانی شەیتان لە قەڵەم دەدرێن بە دەقی ئەم ئایەتە پیرۆزە.

جا ئەگەر زانیت لیژنەی نووسینەوەی دەستور کۆمەڵە هاوبەش و پەرستراو و ڕەتکەرەوە و شەریکێکن بۆ الله عز وجل و دۆستانی شەیتانن، بەدڵنیاییەوە حوکمی ئەوانە ئاشکرا و ڕوون دەبێت لە لات بەڵام لە ڕووی سوودی زیاترەوە دەڵێم: الله عز وجل ئەگەر حوکمێکی دەرکرد ڕازی نیە بۆ هیچ کەسێك کە ئەو حوکمە بگۆڕێت و جێگۆڕی بکات، نموونەی ئەمە لە سورەتی (التوبة) الله تعالى دەفەرموێت:﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾﴾ ،بێگومان ژمارەی مانگەکان لای الله دوانزە مانگە، لە کتێبی الله دا لە (لوح المحفوظ) دا دیاریکراوە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگی بە حەڕام داناوە (واتە جەنگ تیایاندا نابێت بەرپا بکرێت)، هەر ئەوەیە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست، کەوابوو لەو مانگەدا ستەم لە خۆتان مەکەن و جەنگ بەرپا مەکەن.

ئەمە حوکمی الله ـیە -عز وجل- کە کاتێك گەردوون و بوونەوەری دروست کردووە – کە تەشریعێکی کەونی یە- دوانزە مانگی داناوە، بەڵام لە نێو ئەم مانگانە چوار مانگی بە حەڕام

داناوه، ئەمە حوکمی الله ـيە -عز وجل-، موشریکەکانی مەککە مانگە حەڕام کراوەکانیان جێگۆڕکێ پێدەکرد، کە دەگەیشتە موحەڕەم -هەروەك دەزانن ڕەجەب و ذو القعدة و ذو الحجة و موحەڕەم ئەمانە مانگە حەڕام کراوەکانن- جا موشریکەکانی مەککە ئەم مانگە حەڕام کراوانەیان دەزانی بەڵام یەکێکیان کە ئەم کارەی پێ سپێردرابوو دەیوت: مانگێکی حەڕام کراو ئەم ساڵ حەڵاڵە، وە حەڕام کراوەکەشی دەبردە مانگێکی تر بەمەش حەڕامیان حەڵاڵ دەکرد و حەڵاڵیان حەڕام دەکرد، بۆیە ئەمە گۆڕین و تەبدیل کردنە لە حوکمێك لە حوکمەکانی الله عز وجل، جا بۆ ئەو کەسەی گۆڕانکاری دەکات یان تەبدیل دەکات لە حوکمەکانی الله تعالى، لە دەربارەیان دەفەرموێت ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ﴿٣٧﴾ ﴾[١٣]،واتە: بەڕاستی دواخستن و دەستکاری کردنی ئەو مانگانەی کە جەنگ تیایاندا حەرامە، بۆ کاتێکی تر؛ سەرکەشی و ڕۆچوونێکی زیاترە لە کوفر، ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون پێی گومڕا دەکرێن، ساڵێك ئەو دەستکاریە بە حەڵاڵ دادەنێن و ساڵێکیش بە حەرام، بۆ ئەوەی ئەو مانگانە ڕێك بکەون لەگەڵ ژمارەی ئەو مانگانەی کە الله حەڕامی کردوون.

کەوابوو ئەم گۆڕانکاریە لە لایەن موشریکەکانەوە لەو مانگانەدا لە حەڕامەوە بۆ حەڵاڵ کردن و لە حەڵاڵەوە بۆ حەڕام کردن، الله عز وجل نەیفەرموو ئەمە تەنها کوفرە، بەڵکو فەرمووی ئەمە ڕۆچوونی زیاترە لە کوفر؛ چونکە ئەم کارەتان خستە سەر ئەو کوفرەی هەتانبوو بەر لەم کوفرە، بۆیە لیژنەی نووسینەوەی دەستور بە تەنها مورتەد و کافر نین، بەڵکو ڕۆچوونی زیاتریان هەیە لە کوفر پەنا بە الله.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خير الجزاء، بەمەش دێینە کۆتایی بەشی دووەم لە بابەتەکەمان کە بریتی بوو لە حوکمی لیژنەی نووسینەوەی دەستور.

[١٣] التوبة: ٣٧

وتاری

شێخ ئەبی عەلی ئەنباری -تقبه اللّٰە-

بەناونیشانی

لیژنەی نووسینەوەی دەستور – کۆمەڵە پەرستراوێکن لەبری اللّٰە

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ

